# محمد ﷺ
# پێغەمبەری ڕەحمەت ودادپەروەری



مصطفى حسينى طبا طبايى

و:ئاگـــری ئەفشین



# محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾

# پێغەمــــــــــــــبەری

# ڕەحمەت وداد پەروەری

مصطفى حسيني طبا طبايي

و: ئاگری ئەفشین

کورتەیەك لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلام محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ بۆ لاوان.

٢٠١٤ز

﴿بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان﴾

**لە نێوان ئەو کەسانەی کە لە پێکهێنانی بزوتنەوەگەورەکانی مێژوو زۆر کاریگەر بوونـە، یەکێك لەوانە (محمد )پیغەمبەری ئیسلامە ﴿صلی الله علیه وسلم ﴾. عەرەبسـتان پـێش سەرهەڵدانی پێغەمبەر ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ هەرگیز حکومەتێکی تەنهاو بە توانایی بە خـۆوە نـەدیبوو چـەمکی(دەوڵەت ) مانایـەکی نـوێی هـەبوو بـۆ عەرەبـەکان کـە پەرتەوازەببوون هەر کۆمەڵەیـەك شـوێنکەوتەی شـێخی قەبیلەیـەك بـوون گوێڕایـەڵی ئەوانیان دەکـرد. ئـایینی عـەرەب، بتپەرسـتی پـەتی بـووە. پەرەسـتگایەکی قـەدیم وبەناوبانگ کە ناوی (کەعبە ) بوو لە مەککەدا بوونی هەبوو، جێگای تەواف وپاڕانەوەی قەبیلەکانی عەرەب بووە و پڕ بوو لە ژمارەیەکی زۆر بـتی جۆراوجـۆر. زۆرجـار کەعبـە شایەتی هاتنی ژنانێك بوو کە بۆ زیارەتی پەرەستگا دەهاتن بە شـێوەیەکی ڕووت، بـە چواردەوریدا دەسوڕانەوە وشیعریان دەخوێندەوە !! سـەرانی عـەرەب خـراپ و ناپـاك بـوون، نیزامـی ڕیـا خـۆری وبـەردەداریان لـە نێـوان عەرەبـەکان بـەڕیوەدەبرد، و کەنیزەکەکانی خۆیان بۆ زیاد کردنی سەروەت وسامانیان بە زۆر دوچاری کاری نەشیاو فەحشا دەکردنەوە! لەبەرئەوەی ئافرەتەکان توانایی بەژداری جـەنگیان نـەبوو و لـەم بارەوە نەیاندەتوانی پارێزگاریی لە قەبیلەکەی خۆیان بگرنە ئەستۆ زۆربەی جارەکان لە بەشە میرات بێ بەش بوون وە هەندێك جـار خۆیـان لـە پیاوێکـەوە دەگواسـتەوە بـۆ پیاوێکی تر وەك (میرات ).**

بیٚ بەزەیانە، ئەو جۆرە عەرەبە نەفامانەی لە خۆ گرتبوو کە کچیان بە مایەی شەرمەزاری و ئابڕوبەری باوکیان لە قەڵەم دەدا و زۆر جار کچانی بیٚ تاوانیان زیندە بە گۆڕ دەکرد!

لە عەرەبستان کۆمەڵێك یەهوودی دوور لە مەککە ﴿شوێنی لە دایك بوونی محمد صلی الله علیه وسلم﴾ژیانیان بەسەر دەبرد و هەروەها لە ناوچەی نەجران مەسیحیەکان دەژیان بەڵام هیچ کام لەوان نەیان توانیبوو ڕێگر بن لە عەرەبەکان و کاریگەریەکی گرنگیان هەبێت لە بیری عەقیدەی ئایینی وئەخلاقیاندا بەڵکۆ خۆیان لە گومان وخورافتدا نوقم ببوون.

لەم جۆرە ژینگەیەدا ﴿محمد صلی الله علیه وسلم ﴾بەرامبەر بەساڵی ٥٧٠ م، چاوی بە دونیا هەڵێنا. باوکی (عبدالله )کە سەرقاڵی کاری کڕین وفرۆشتن بوو، دوومانگ بەر لە دایك بوونی منداڵە تاقانەکەی ماڵئاوی لە ژیان کرد و دایکی (ئامینە )تەقریبەن لە دوای شەش ساڵ لە دایك بوونی ئەو وەفاتی کرد ( سیرة ابن هیشام).

محمد ﴿صلی الله علیه وسلم ﴾ژیانی منداڵی زۆر بە تاڵی و هەتیوی تێپەڕاند. ژیانی ڕۆژانەی بە شوانیەتی لە سەحراکانی عەرەبستان تێدەپەڕاند، و هیچ کات نەچوبووە قوتابخانە و خوێندن و نوسین فێر نەببوو. ئەو بە کەمی لە شوێنی لە دایك بوونی (مەککە )دەچووە دەرەوە. لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا لە گەڵ بێوەژنێك بە ناوی (خەدیجە)

**كە ٤٠ ساڵی بوو پەیمانی هاوسەرگیرێتیان بەست. وە تائەو کاتەی خەدیجە زیندوو بوو ژنی تری نەهێنا .**

**بە هۆی ئەوەی کە خەدیجە ئافرەتێکی ماڵدار بوو محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ لە زەحمەتی بژێوی ژیانی ئاسودە بوو. محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ پێش دەورانی پێغەمبەرایەتی لە ڕوانگەی ئەخلاقیەوە جێی سرنجی خەڵکی مەککە بوو، بەهۆی ڕاستگۆیی و دەستپاکیەکەی نازناوی (محمد امین )یان پێ بەخشیبوو.**

**لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا خەونە ڕاستگۆیانەکانی محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ هاتنە دی و لەساڵی چلەم لە لەتەمەنیدا شەوێك لە شاخێك لـە نزیـك مەککـە بـۆ یەکـەم جـار فریشتەی خوای بینی! بینی کە لـە ئاسـۆی بـەرزایی ئاسمـان دادەبـەزێت. فریشـتەی پەروەردگار فەرمانی خوێندنی کتیبی خودای پێدا کە نە کتێبێکـی خوێندبویـەوە و نـە فێریش ببوو ! بۆ یەکەم جارئەو ئایەتانەی کە لەو شەوەدا دابەزنیـە خـوارەوە بـۆ سـەر محمد﴿صـــــلی الله علیـــــه وســــــلم﴾ ئـــــەم ئایەتانــــــە بـــــــوون:**

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ٣ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ٤ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ٥﴾
(العلق) .

﴿(ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) بخوێنە

بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە
ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە
.بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە.ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی و زانیاری فێر کردووە.
ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوون.﴿

**دوای ئەوە، بە درێژایی بیست وسیٚ ساڵ،شەو ڕۆژ لە سەفەرو لە ئامادەیدا فریشتەی پەروەردگار دەهاتە خوارەوە بۆ محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ و هانی دەدا بۆ خوێندنەوەی بەشێك لەم کتێبە پیرۆزەکەی موسڵمانەکان کە ناوی قورئانە.**

**محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ کە خۆی نەیدەتوانی بنوسیٚ ئەم وشانەی بە هاوەڵەکانی دەنوسیەوە و لە سەر ئێسقانی ئاژەڵ و بەرگی درەختەکان دەنوسرانەوە، دواتر لە ڕوی ئەو نوسراوانە چەند نوسخەیەکی تەواویان ئامادەکرد.**

**ڕێنماییەکانی قورئان لەسەرەتای بانگەشەوە، لە سەر بنەمای یەکتاپەرەستی تەواو بنیادنرابوو. جیهان لە ڕوانگەی قورئانەوە نیزامێکی یەگانەو هەماهەنگی نیشان دەدات کەبە نوێنەری ویستی یەك فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدار دەژمێردرێت لەبەر ئەوە لە ڕوانگەی**

**قورئانەوە هیچ شوێنێك بۆ خواكان وئارەزووە پەرت وبلاّوە جیاوازەكان لە گەردوون بوونی نییە:**﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ... (الأنبياء ٢٢)﴾

**﴿ئەگەر لە هەردووكیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند پەرستراوێك هەبوایە جگە لە خوا بێگومان (ئاسمان و زەوی) هەر دوو كاول و وێران دەبوون....﴾**

**لە بیرۆكەی قورئاندا بەدیهێنراوەكان بەرەو ئایندەیەك كە (هەڵسانەوەی گەورەیە ) ڕێ دەگرنە بەر:**

وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ ) **﴿وە بەڕاستی قیامەت دێت (بەرپا دەبێ)﴾**
((... ) الحج ٧

**وە لەم ناوەندەش مرۆڤ، زیاتر لە هەموو بوونەوەرانی زەوی وئاسمان بەرپرسیارن وە یان بە وتەی قورئان باری ئەمانەتی پەروەردگار مرۆڤەكان هەڵیان گرتووە:**

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ٧٢ (الأحزاب)﴾

**﴿ئێمە ئەمانەتی (عەقیدە و بیروباوڕ، ئەمانتی سەرپشكیمان) نیشانی ئاسمانەكان و زەوی و كێوەكان دا، (یاخود پێشنیارمان كرد كە ئێوە هەڵگری ئەم ئەمانەتە بن)،**

بەلاّم هەمووان دەستیان پێوەناو ترسان لێی (هەر پێیان چاك بوو ئاوا (مسیر بن، سەرپشك نەبن) كەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی، بەڕاستی زۆر ستەمكار و نەفام بوو (ئەگەر زۆرینە ڕەچاو بكەین).﴾

لە ڕوانگەی قورئانەوە سەرهەڵدانی ئاینەكان بۆ ئەوە بووە كە ڕێنمونی مرۆڤەكان بكەن بە حیكمەتێكی تەواو، و لە بەدیهێنان وپاك كردنەوەی نەفس لە پەستیە ئەخلاقیەكان:

﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (البقرة ١٢٩)﴾

﴿پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵكەی كە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێك لە خۆیان ڕەوانە بكە، تا ئایەتەكانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو فێری كتێبە پیرۆزەكەی تۆ (واتە قورئان) و دانایان بكات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و كردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بكاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خوایەكی بالاّدەست و دانایت.﴾

وە بەدیهینانی دادگەری كۆمەلایەتی:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ... (الحديد ٢٥)﴾

﴿سوێند بەخوا بێگومان ئێمە پێغەمبەرەكانمان ڕەوانە كردووەهاوڕێ لەگەڵ بەڵگە و نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشكراداو كتێبە ئاسمانەكانیشمان هێنایە خوارەوەكەلەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕوون كردونەتەوە تا خەڵكی بەعەدالەت و دادپەروەریی ڕەفتار بكەن،..﴾

**شێوەیەكی پەسەندكراو بوو بەڵام شوێنكەوتوانی مەزهەبەكان بە بەردەوامی لە ڕێنمایەكانی یەكەم جار دوریان دەكرد وڕێگەی جیاواز ولێك جیایان دەگرتە بەر:**

﴿فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (المؤمنون٥٣)﴾

﴿بەڵام زۆربەی خەڵكی بیرو بۆچوونی خۆیان بەش بەش و پارچە پارچە كرد (لە بەرنامەی یەكخواناسی لایاندا)، هەموو دەستەو تاقمێك بەو بەرنامەو نەخشەیەی هەیانە دڵخۆشن.﴾

**و پێغەمبەر محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ كۆتا پێغەمبەر بوو :**

﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا (الأحزاب ٤٠)﴾

﴿محمد وەنەبی باوكی هیچ كەس لە پیاوانتان بێت بەڵكو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێك زانایە.﴾

**هەروەها بۆ چاکسازی کردنی ئایینەکان و چارەسەر کردنی ئەو شتانەی کێشەیان لەسەر هەبوو نێردرابوو:**

﴿تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ٦٤ (النحل)﴾

**﴿سوێند بە خوا پێش تۆ بۆ گەل و قەومەکانی تریش پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردووە، بەڵام شەیتان کارو کردەوەی (نادروست و هەڵەیانی) بۆ ڕازاندوونەتەوە، ئەمڕۆ لە دنیادا هەر ئەو پشتیوانیانە و سزای بەئێش بۆ ئەو جۆرە قەوم و کەسە نا لەبارو ناحاڵیانە ئامادە کراوە ...ئێمە ئەم قورئانەمانەمان دانەبەزاندووەتە سەر تۆ تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە هەرچی ئەو خەڵکە کێشەی لەسەر هەیە (لە بابەتەکانی دنیاو دین) بۆیان ڕوون بکەینەوە و بیکەینە هۆی هیدایەت و ڕەحمەتیش بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕ دەهێنن﴾**

**هەروەها بۆ بە تەواو گەیاندنی ئاکارە باشەکان نێردرابوو :**﴿بعثت لاتمم مكارم الاخلاق﴾ **فەرمودەی پێغەمبەر﴿ صلی الله علیه وسلم﴾.**

**پێغەمبەر محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ بە توندی ڕووبەڕوی بت پەرەستی بویەوە چونکە ئەم کارەی بە داڕوخانی مرۆڤەکان لە قەڵەم دا .**

**سێتایی بوون لە ڕوانگەی قورئانەوە ڕەد کرایەوە واتا:**

﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ .... (المائده٧٣)﴾

﴿سوێند بێت بەخوا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا یەکێکە لە سێ دانە خوا (لە حاڵەتێکدا): هیچ خوایەك، هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە خوایەکی تاکو تەنها،...﴾

**وە بانگەشەی هیچ خوایەکی نەکردووە جگە لە خوای تاك وتەنها:**

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ (الانبياء٢٥)﴾

﴿ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەك نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.﴾

**قورئان ڕاهیبەکان وزانا ئایینیەکانی کە کۆمەڵانی خەڵکیان بۆ مرۆڤ پەرەستی وادار کربوو:** ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ... (التوبة٣١)﴾

﴿(گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا﴾

**وە ماڵ و دارایی خەڵکیان بە ناحەق دەخوارد زۆر بە توندی مەحکوم کرد:**

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ... (التوبة ٣٤)﴾

**﴿ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، چاك بزانن كە زۆربەی حاخام و مالومەكانی جوو و قەشەی گاوران، ماڵ و سامانی خەڵكی بەناحەق دەخۆن،....﴾**

**جیاوازی نەژادی لە ڕوانگەی قورئانەوە بە تەواوی نادروست بوو هەموو تاكەكانی مرۆڤ لە ژن و پیاوێكەوە بەدیهاتوون، هیچ كەس باوی نادرێت بەسەر كەسی تردا مەگەر لە ڕوی تەقواو خواپەرەستیەوە نەبێت ئەویش لە لای پەروەردگارەوەیە:**

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (الحجرات ١٣)﴾

﴿ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێرو مێ یەك وە كردومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەكتری بناسن بەڕاستی بەڕێز ترینتان لای خوا پارێزگار

تـريـنـتـانـه بـێـگـومـان خـوا زانـای ئـاگـاداره.﴾

محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ڕای دەسپارد کە فێربوونی زانست لە سەر هەموو موسڵمانێك پێویستە.

بیرۆکەی قورئان لەبارەی (سەروەت )ئەوە بوو کە نابێت سەروەت تەنها لە دەستی دەوڵەمەندەکاندا بێت: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ .... (الحشر ٧)﴾

﴿بۆ ئەوەی ئەو سامانە تەنها لە نێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت،﴾

بەڵکو دەبێت لە نێوان هەموو چینەکان دابەش بکرێت.

قورئان بۆ ئافرەتانیش وەك پیاوان مافی دیاری کرد:

﴿...وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ... (البقرة ٢٢٨)﴾ ﴿ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان﴾

وە ڕێگری کرد لە زوڵم وناحەقی کردن بەرامبەر بە ئافرەتان.

لە ڕوانگەی قورئانەوە یەکێك لە مەرجەکانی تێپەڕین لە پلە سەختیەکان وچوونە بەهەشتەوە ئازاد کردنی کۆیلەیە:

﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ ١١ وَمَا أَدْرَاكَ مَا

الْعَقَبَةُ ١٢فَكُّ رَقَبَةٍ ١٣ (البلد)﴾

﴿كەچی هێشتا(زۆرێك لە خەڵكی) پەلاماری پلەی سەختی نەداوە ...تۆ چوزانییت پلەی سەختی کامەیە... ئازاد کردنی کۆیلەیە...﴾

بە گشتی قورئان گەورەترین موعجیزەی محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ بوو، لەبەر ئەوەی محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ خوێندەواری نەبوو کتێبێکی هێنا کە بابەتەکانی سەبارەت بە پەروەردگار، سروشت، ژیان، یاساکانی ماف و بنەما ئەخلاقیەکان و عەقیدەی میلەتەکان و چیرۆکی پێغەمبەرەکان ﴿سەلامی خوایان لێبێت﴾و ڕووداوەکانی دوای مردن وپێشبینیە ڕاستەکان .. وبابەتی زۆری تری لە خۆ گرتووە. وە هەموو ئەمانە بە ئەسلوبێکی وا ڕێکخراوە نە لە شیعر دەچێت و نە بە پەخشانیش بەیان کراوە!

وە لە ڕوانگەی جوانی وتەکانی و نواندنی ماناکانی پاکی ڕێنمایەکانی و دوور بوون لە دژیەکی، لە پلەیەکدایە کە بانگی هەموو ئەوانەی کردووە کە دژایەتی دەکەن هەموویان بە یارمەتی یەکتر کە (یەك بەش یان یەك سورەت )وەك ئەو بێنن بەڵام نەیانتوانی! بە ووتەی قورئان هیچ کات کەس ناتوانێت!

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ٢٣ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا

## وَلَـن تَـفْـعَلُـوا . . . ) الـبقـرة ٢٣-٢٤﴾

﴿وەئەگەر ئێوە لەگومان دان لەم (قورئانــەی) کەناردومانەتــە خــوارەوە بــۆ بەنــدەی خۆمان موحەممەد﴿صلی اللە علیە وسلم﴾ دە سورەتێك بێنن بەوێنەی ئـەو،وە بـانگی هاوکارەکانتان بکەن( لەڕەوان بێژان وشاعیران) بێجگەلە خوا ئەگەر ڕاسـت دەکـەن، بەفەرموودەی خوای نازانن. ئینجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد؟ وەهەرگیز نایشی کەن..﴾

لە مەککە کۆمەڵێك باوەڕیان بە محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ هێنا کە ئەوانە لە خزم ونزیکانی خۆی بوون. بەڵام لەوەی کە مەککە بە شارێکی پیرۆزی بت پەرەستەکان دەژمێردرا، هەموو ساڵێك قەبیلەی عەرەبەکان بۆ زیارەتی بتەکانیان بەرەو مەککە دەهاتن لەم ڕووەوە سەرانی مەککە خۆیان بە زیان لێکەوتوو دەزانی بەهۆی ڕووبەڕوبوونەوە خۆڕاگرییەکەی محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ بەرامبەر بە بت پەرەستی، ئەو دەمارگیرییەی کە لەپەیڕەوی باو باپیرانیان هەیانبوو ڕێگربوو کە مەککەیەکان هەموویان بانگەوازەکەی محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ قەبووڵ بکەن، بەڵکو زۆر بە سەختی و ڕەفتاری خراپ بەرامبەر بە پێغەمبەر ویارانی دەجولانەوە. محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ لەم کاتانەدا زۆر خۆڕاگر بوو و هانی هاوەڵەکانیشی دەدا لە سەر ئارام گرتن و بەردەوامبوون. هەر لەوکاتانەدا بوو کە چەند تایفەیەك دەهاتن بۆ زیارەتی کەعبە محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ بانگی دەکردن بۆ ئاینی خوا (ئیسلام).

دەرئەنجام دوای ١٣ ساڵ دان بەخۆداگرتن محمد ﴿صلی اللە علیەوسلم﴾ بڕیاری

**کۆچ کردنی دا لە مەککەوە کە بەش بەش هاوەڵەکانی ودواتر خۆشی لە شەوی کۆچ کردنی کە گیانی لە مەترسی دابوو بەرەو شارێکی تر کە ناوی (یەسریب) یان مەدینە بوو کۆچیانکرد.**

**دانیشتوانی شارە نوێیەکە، کە زۆربەیان بەهۆی محمد ﴿صلی الله علیەوسلم﴾وە ئیمانیان بە خوای تاك وتەنها هێنابوو وئیسلامیان هەڵبژاردبوو، پێشوازیەکی زۆر گەرمیان لە محمد ﴿صلی الله علیەوسلم﴾ و هاوەڵەکانی کرد کە بە (مهاجر)ناسرابوون.**

**پێغەمبەر لە (یەسریب)کە بە (مدینە النبی )ناسرا مزگەوتێکی بونیاد نا کە بە مەڵبەندی فێربوون وپێگەی پێشوایی لە قەڵەم دەدرا و لە نیوان کۆچ کردوانی مەککە وئیماندارانی مەدینە کە بە (انصار)ناودەبران پەیمانی برایەتی بەست وە کۆمەڵگای ئیماندارانی دامەزراند و لەبەرئەوەی کۆمەڵێك لە یەهودییەکان لەو شارە نوێیەدا دەژیان، یاسایەکی بۆ ئەو شارە دانا کە مافی هەموو دانیشتوانی شارەکە پارێزراوبێت و لەگەل یەهودیەکانی مەدینە پەیمانی هاوکاری و یە کگرتوییان بەست دژ بە بیٚ باوەڕەکان.**

**بانگەوازی بۆ قەبیلە جیاوازەکانی عەرەب کرد بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام. زۆری نەخایاند کە بت پەرەستەکانی مەککە لە پەرەسەندنی ئاینەکەی ترسیان لیٚ نیشت و بە سوپایەکەوە کە سیٚ بەرابەری سوپاکەی پێغەمبەر ﴿صلی الله علیەوسلم ﴾ بوو ڕووبەڕو بوونەوە. لەم جەنگەدا کە بە جەنگی بەدر ناسراوە، چەند موعجیزەیەك لە پێغەمبەر**

**﴿صلى الله عليەوسلم﴾ ئاشکرابوو کە مستێك خولّ ورِملّی هەڵگرت وپەرتی کرد بەڕوی دوژمنەکانیدا کە توفانێکی گەورە دەستی پێکرد وە بە ووتەی قورئان:**

﴿وَأنـزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَـرَوْهَـا ... (الـتـوبـة ٢٦)﴾

﴿ وە سەربازانێکی (لە ئاسمانەوە) ناردە خوارەوە کە ئێوە نەتاندیین..﴾( بۆ زانیاری زیاتر لەسەر جەنگی بەدر بگەڕێوە بۆ ئایەتەکانی ٩و١٠و١٢ لە سورەتی الأنفال)

**وە بێباوەڕەکان بە سەختی شکستیان خواردو کوژران وبەدیل گیران. محمد ﴿صلى الله علیەوسلم﴾ لە گەلّ دیلەکان خراپ ڕەفتاری نەکرد و لە بڕینی ئەندامی لاشەی کوژراوانی جەنگ کە عادات وتەقالیدی عەرەبەکان بوو ڕێگری کرد.**

**دوای ئەوە پەیتا پەیتا جەنگ لە نێوان محمد ﴿صلى الله علیه وسلم﴾ و بێ باوەڕەکانی مەککە وهاوپەیمانەکانی ئەوان ڕویدەدا کە ناسراوترینی ئەو جەنگانە ئوحد وخەندەق بوو و لە زۆربەی جەنگەکان پێغەمبەر ﴿صلى الله علیه وسلم﴾ ویارانی سەرکەوتوو بوون. سەرەنجام پەیمانی ئاگر بەست لە نێوان ئەو و مەککیەکان بەسترا، وە لەبەرئەوەی بێ باوەڕەکانی مەککە گوێڕایەڵی مەرجەکانی ناو پەیمان نامەکەیان نەکرد محمد ﴿صلى الله علیه وسلم﴾ هێرشی برد بۆ مەککە کە بە ئاشتی فەتحی کرد.**

**بتەکانی شکاند و لە کەعبە فڕێی دانە دەرەوە وەئەو پەرستگا گەورەییەی تەرەخان کرد بۆ پەرەستنی خوای تاك وتەنیا و لەگەلّ ئەو هەمووە ئازارەی کە بێ باوەڕەکانی مەککە بەرامبەر بە پیغەمبەر وهاوەڵەکانی کردبوویان فەرمانی لە ناوبردنیانی دەرنەکرد بەڵکو**

هەموویانی بەخشی. ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی مەککە بە ویست و مەیلی خۆیان بێنە ناو ئیسلامە وەك قورئان بەیانی کردبوو:

﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا (النصر ٢)﴾

﴿وە خەڵکت دیی کە پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە﴾

دوای ئازاد کردنی شاری مەککە محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ ڕووبەڕوی بێ باوەڕەکانی تر بویەوە و یەهودیەکانی مەدینەش کە ناپاکیان کرد لە پەیمانەکە و لە دژی پێغەمبەر ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ لەگەڵ بێباوەڕەکان هاوکاریان دەکرد بۆ نانەوەی ئاشوب ودووبەرەکی بۆیە سزادران ودوور خرانەوە. لانی کەم سەرانسەری عەرەبستان کەوتە دەست ئیمانداران و محمد ﴿صلی الله علیه وسلم﴾ حکومەتێکی تەنهای لەسەر بنەمای قورئان دامەزراند.

پێغەمبەرەکانی پێشتر ﴿سەلامی خوایان لێبێت﴾ هەریەکەیان بە موعجیزەیەکەوە سەریان هەڵدا بەڵام پێغەمبەر محمد ﴿صلی الله علیەوسلم﴾ خۆی بە موعجیزەی مێژوو لە قەڵەم دەدرێت! ئەو پیاوێك بوو بەرهەمی کارەکەی زیاد لە هەموو پێغەمبەرەگەورەکان وپیاو چاکان بووە!

لەگەڵ ئەوەی کە خوێندەواری نەبووە بەڵام گەورەترین فەرهەنگی ئایینی دامەزراند! وە لەگەڵ ئەوەی کارمەندی هیچ دەوڵەت وحکومەتێك نەبووە بەڵام حکومەتێکی نیرومەند

**وبەتوانای دامەزراند! لەگەڵ ئەوەی فەرماندەی سوپای نەکردبوو و شێوە و دەستوری جەنگ فێر نەببوو بەڵام گەورەترین فەرماندەی جەنگی لێ دەرچوو. هەم مامۆستا بوو هەم پێشەوای حکومەت هەم دادوەر ویاسادانەر وفەرماندەی جەنگ و وتارخوێنی گەورەو ئیمامی جەماعەت بوو! لەگەڵ ئەم هەمووە گرفتاریانەشیدا ژمارەیەك خێزانی هەبوو و لەگەڵ هەمویان بەباشترین شێوە وئەوپەڕی ڕەزامەندیدا ئیدارەی دەکرد! وە لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا خەریکی تەقواو خۆپاراستن و شەو زیندوو کردنەوە بووە بە عیبادەت کردن و زیاد لە هەموان عیبادەتی دەکرد! لەگەڵ هەموو ئەمانە هیچ کات نەیویستووە شوێنکەوتوانی پلەی ئەو زیاتر لە مرۆڤێك برنە سەرەوە وە پیرۆزی بکەن و بیپەرەستن، بەڵکو هەموو ڕێنمایەکانی بە پێچەوانەی ئەم بیرۆکانە بوو.**

**بەدانپێدانانی لە لایان دوژمنەکانیشی و لە گەڵ ئەم هەمووە فتوحات و دەسەڵاتانەی بە دەستی هێنا، ژیانی ئاسایی وسەرەتایی خۆی نەگۆڕی. لەبەرامبەر پاشا زلهێزەکان خۆی نەدەنواند، بەڵکو هەمیشە خۆی بە ﴿بەندەی خوا﴾لە قەڵەم دەدا کە بەبێ ویستی خۆی ڕاسپێردراوە تاوەکو پەیامی خوا بەخەڵك ڕابگەیەنێت.**

**پەیامەکەی پێغەمبەر محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ هەروەك لە قورئاندا هاتووە تەنها تایبەت بە عەرەبەکان نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی کە تەواوترین پەیامی ئیلاهیە ڕوی کردۆتە هەموو جیهان:**

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ (التكوير٢٧)﴾﴿ **ئەو قورئانە تەنها ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانیان﴾**

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ... (الأعراف١٥٨﴾

**﴿ئەی موحەممەد﴿صلى الله عليه وسلم﴾ بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان﴾**

**ژیانی پێغەمبەر محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ سەرمەشقێکی گەورەیە بۆ هەموو خەڵك کە ژیانیان لەناو ئیمان وتێکۆشان و ئامانجداری دەبەنە سەر و ئمتیاز ومانا دەبەخشێت بە ژیانی مرۆڤەکان. محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ ١٠ ساڵ دوای کۆچ کردنی لە مەککە وە، لەشاری مەدینە لەئامێزی خێزان وهاوەڵەکانیدا وەفاتی کرد.**

﴿وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ١٨١ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ١٨٢ (الصافات)﴾

# سەرچاوەکان

قورئانی پیرۆز: کتێبی پیرۆزی موسڵمانەکان

جامع البيان في تأويل أي القران: طبرى

الأصنام: كلبى

سيرة النبوية: ابن هشام

تاريخ الرسل والملوك: طبرى

تاريخ اليعوبى: يعقوبى

المو طا:مالك بن أنس

المغازى:واقدى

الإتقان فى علوم القران:سيو طى

